١ - عبدالله بن عباس رضي الله عنهما لە تەفسیری ئایەتی : ﴿ فَلْيَضْحَكُوا قَلِيلًا وَلْيَبْكُوا كَثِيرًا : با کەم پێبکەنن و زۆر بگرین ﴾ (التوبة : ٨٣)

ئەفەرمووێت : (دنیا کەم و کورتە، جا با تێیدا پێبکەنن ئەوەندەی ئەیانەوێت، ئەوکاتەی مردن و بران بۆلای الله تعالى، دەست ئەکەن بە گریانێک کە هەرگیز تەواو نابێت) .

٢ - ﴿ سَوَاءٌ عَلَيْنَا أَجَزِعْنَا أَمْ صَبَرْنَا مَا لَنَا مِنْ مَحِيصٍ : جیاوازی نییە ئەگەر بیکەین بە هەرا و بگرین، یان ئارام بگرین، هیچ پەنایەکمان نییە ﴾ (إبراهيم : ٢١)

رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت :

(ئەهلی ئاگر ئەڵێن : ' وەرن با ئارام بگرین ' ، جا پێنسەد ساڵ ئەوەستن، کاتێک ئەبینن کە ئەوە سوودی نییە ئەڵێن : ' وەرن بیکەین بە هەرا و ئارام نەگرین ' ، جا پێنجسەد ساڵ ئەگرین، کاتێک بینیان ئەوەش سوودی نییە ئەڵێن : ﴿ سَوَاءٌ عَلَيْنَا أَجَزِعْنَا أَمْ صَبَرْنَا مَا لَنَا مِنْ مَحِيصٍ ﴾ (إبراهيم : ٢١)

٣ - عمرو بن دینار ئەڵێت :

(پێم گەیشتووە کاتێک ئەهلی ئاگر هاوار ئەکەن ئەڵێن ﴿ يَا مَالِكُ لِيَقْضِ عَلَيْنَا رَبُّكَ : ئەی مالک با پەروەردگارت بمانمرێنێت ﴾ .

هەزار ساڵ وەڵامیان ناداتەوە، پاشان ئەڵێت | إِنَّكُمْ مَاكِثُونَ : ئێوە لێرە ئەمێننەوە | .

٤ - عبدالله بن عباس رضي الله عنه لە تەفسیری وتەی تبارک و تعالی | وَنَادَوا يَا مَالِكُ لِيَقْضِ عَلَيْنَا رَبُّكَ : هاواریان کرد ئەی مالک با پەروەردگارت بمانمرێنێت | .

ئەفەرمووێت : هەزار ساڵ لەسەریان وەستا، پاشان پێی وتن : | إِنَّكُمْ مَاكِثُونَ : ئێوە لێرە ئەمێننەوە | .

---

: مالک دەرگاوانی جەهەننەمە .

٥ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت :

(خاوەنی سوکترین سزا لە ڕۆژی قیامەتدا کەسێکە پشکۆی خەڵوز خراونەتە ژێر پێیەکانی، بەهۆیەوە مێشکی ئەکوڵێت وەک چۆن مەنجەڵ یان قاپ ئەکوڵێت) .

٦ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت :

(أبو طالب خاوەنی کەمترین سزایە لە ڕۆژی قیامەتدا، دوو نەعلی لە ئاگر لەپێدایە بەهۆیەوە کەللەسەری ئەکوڵێت) .

٧ - عبدالله بن مسعود رضي الله عنه ئەفەرمووێت :

(خاوەنی کەمترین سزا لە جەهەننەمدا کەسێکە کە دوو نەعل و پەتی ئاگرینی لەپێدایە، بەهۆیەوە مێشکی ئەکوڵێت وەک چۆن مەنجەڵ و قاپ ئەکوڵێن، وا ئەزانێت لە جەهەننەمدا هیچ کەسێک لە ئەو سزاکەی توندتر نییە، بەڵام هیچ کەسێک نییە لە جەهەننەمدا هێندەی ئەو سزاکەی سووک و ئاسان بێت) .

٨ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت :

(خاوەنی کەمترین پلە لە بەهەشتدا کەسێکە کە خانوویەکی هەیە لە یەک مرواری، ژوورەکان و درگاکانی لە مروارین، وە خاوەنی کەمترین سزا لە قیامەتدا کەسێکە کە دوو نەعلی ئاگرینی لەپێدایە، بەهۆیەوە مێشکی ئەکوڵێت وەک چۆن مەجەڵ ئەکوڵێت، گوێیەکانی لە خەڵوزن، وە کاکیلەکانی لە خەڵوزن، وە لێوەکانی پارچەیەکن لە ئاگر، ناو سکی لەملاولا و پێیەکانیەوە دێتە دەرەوە، وە هەموویان وەکو کۆمەڵە دەنک و تۆوێکی کەمن لە ئاوێکی زۆری کوڵاودا) .

٩ - حماد بن سلمة ئەڵێت :

(بۆم گێڕدراوەتەوە کە ئاگر لە دەم و چاوی ئەهلی ئاگرەوە ئەڕوات و لە پاشیانەوە دەرئەچێت، وە لە پاشیانەوە ئەڕوات و لە دەم و چاویانەوە دەرئەچێت) .

١٠ - الحسن البصري له تەفسیری ئایەتی : | لَابِثِينَ فِيهَا أَحْقَابًا :
چەندین حوقبە تێیدان - واتە کافران لە جەهەنەمدا - | .

ئەڵێت : (کۆتایی نییە، کاتێک حوقبێک تەواو بوو، ئەچنە ناو حوقبێکی ترەوە) .

---

: واتە کافران عەزابەکەیان کۆتایی نییە و هەتا هەتایە لە جەهەننەمدان، هەر حوقبێک حەفتا هەزارساڵی قیامەتە، وە هەرڕۆژێکی ئەو حوقبەیە حەفتا هەزارساڵی دنیایە، وەک چۆن الطبري هێناویەتی لە تەفسیرەکەی .

والله أعلم هەرحوقبێک نزیکەی ئەوەندە ساڵی دنیایە :

1،788،500،000،000

١١ - عبدالله بن مسعود رضي الله عنها لە دەربارەی ئایەتی | فَسَوْفَ يَلْقَوْنَ غَيًّا | (مريم : ٥٩) .

ئەفەرمووێت : (دۆڵێکە لە جەهەننەم) .

١٢ - ﴿فَخَلَفَ مِن بَعْدِهِمْ خَلْفٌ أَضَاعُوا الصَّلَاةَ وَاتَّبَعُوا الشَّهَوَاتِ فَسَوْفَ يَلْقَوْنَ غَيًّا﴾ (مريم : ٥٩)

عبدالله بن مسعود رضي الله عنه دەربارەی ئایەتی ﴿فَسَوْفَ يَلْقَوْنَ غَيًّا﴾ ئەفەرمووێت : (ڕووبارێکە لە جەهەننەم) .

١٣ - وە ئەفەرمووێت : (ئەوە ڕووبارێکە لە جەهەننەم، پێی ئەوترێت غَيّ) .

١٤ - وە ئەفەرمووێت : (الغَيّ ڕووبارێکە لە جەهەننەم، ئەوانەی شوێن شەهەوات کەوتوون فڕێ ئەدرێنە ناوی) .

١٥ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت :

(وەیل دۆڵێکە لە جەهەننەم، کافران فڕێ ئەدرێنە ناوی بە حەفتا پایز ناگەن بە بنەکەی، وە الصَّعود چیایەکە لە ئاگر حەفتا پایز پیایدا سەرئەکەوێت، پاشان لەوێوە بە هەمیشەیی فڕێ ئەدرێنە خوارەوە) .

١٦ - عبدالله بن عباس رضي الله عنه ئەفەرمووێت : (وَیل دۆڵێکە لە جەهەننەم، تەنها الله تعالى ئەزانێت چۆنە) .

١٧ - العلاء بن مسيب لە باوکیەوە ئەگێڕێتەوە کە ئەڵێت : (ئەوە دۆڵێکە لە جەهەننەم، پێی ئەوترێت وَیل) .

١٨ - أبو سعيد الخدري رضي الله عنه لە تەفسیری ئایەتی ﴿سَأُرْهِقُهُ صَعُودًا﴾ (المدثر : ١٧)

ئەفەرمووێت : (ئەوە بەردێکە لە جەهەننەم، کاتێک دەستیان دائەنێن لەسەری ئەتوێتەوە، وە کاتێک دەستیان لەسەری لائەبەن وەکو خۆی لێ دێتەوە).

١٩ - سعيد بن المسيب ئەڵێت :

(چیایەکە لە جەهەننەم ناچارئەکرێن بەسەریدا سەر بکەون، هەرکاتێک دەستەکانیان بخەنە سەری ئەتوێتەوە، وە کاتێک دەستیان لابرد وەکو خۆی لێ دێتەوە) .

٢٠ - أبي هريرة رضي الله عنه ئەفەرمووێت :

( - لە جەهەننەمدا - لە نێوان پێست و ئێسکی کافرەکاندا چەندین کرمی تێدایە غار ئەدەن وەکو کەرەکێوی، وە مارەکانی وەکو ملی حوشتر وان - لە ئەستوریدا -، وە دووپشکەکانی وەکو هێستری ڕەشن) .

٢١ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت :

(لە جەهەننەمدا ماری وای لێیە وەکو ملی حوشتر وایە، کاتێک یەکێکیان ئەگەزێت حەفتا پایز هەست بە گەرمیەکەی ئەکات، وە دووپشکی وای لێیە وەکو هێستری کۆپاندار وایە، کاتێک یەکێکیان ئەگەزێت حەفتا پایز هەست بە گەرمیەکەی ئەکات) .

**٢٢ - عمرو بن ميمون** ئەڵێت :

(لە نێوان پێست و گۆشتی کافردا نەڕەی کرم ئەبیسترێت، وەکو نەڕەی وەحشە) .

**٢٣ - ثور بن يزيد** ئەڵێت کە ڕۆژێکیان رسول الله ﷺ هات بۆ لایان و ڕەنگی گۆڕابوو، پاشان فەرمووی : (لە جەهەنەمدا دۆڵێکی لێیە کە جەهەننەم ڕۆژی حەوت جار پەنا ئەگرێت لە شەڕی ئەو دۆڵە، وە لەناو دۆڵەکەدا بیرێکی لێیە کە جەهەننەم و ئەو دۆڵە پەنا ئەگرن لەو بیرە، وە لەناو بیرەکەدا مارێکی تێدایە کە جەهەننەم و دۆڵ و بیرەکەش پەنا ئەگرن بە الله عز وجل لەو مارە حەوت جار، الله دایناوە بۆ ئەو جەهەنەمیانەی کە هەڵگری قورئانن، ئەوانەی سەرپێچی الله ئەکەن لەوەی لە قورئاندا هەیە) .

**٢٤ - البراء بن عازب** رضي الله عنه ئەڵێت کە رسول الله ﷺ پرسیاری لێکرا دەربارەی وتەی تبارک و تعالى : | **زِدۡنَٰهُمۡ عَذَابًا فَوۡقَ ٱلۡعَذَابِ** | (**النحل** : ٨٨) .

فەرمووی : (کۆمەڵە دووپشکێکن وەکو داری خورما بەرزن، لەناو جەهەننەمدا پێیانەوە ئەدەن) .

**٢٥ - عبدالله بن مسعود** رضي الله عنه دەربارەی ئایەتی : | **زِدۡنَٰهُمۡ عَذَابًا فَوۡقَ ٱلۡعَذَابِ** | (**النحل** : ٨٨) .

ئەڵێت : (کۆمەڵە دووپشکێکن کەڵبەکانیان وەکو دار خورمای بەرزە) .

٢٦ - رسول الله ﷺ دەربارەی وتەی الله تبارك و تعالى : | كَٱلۡمُهۡلِ | (الكهف : ٢٩) .

ئەفەرمووێت : (وەکو ڕۆنی قرچاو وایە، کاتێک نزیک ئەکرێتەوە لێی پێستە سەری ئەکەوێتە ناوی) .

٢٧ - عبدالله بن عباس رضي الله عنه دەربارەی وتەی الله تبارك و تعالى : | كَٱلۡمُهۡلِ | (الكهف : ٢٩) .

ئەڵێت : (ئاوێکی بەهێز و توونده وەکو پاشماوەی ڕۆن) .

٢٨ - الضحاك بن مزاحم دەربارەی | بِمَآءٖ كَٱلۡمُهۡلِ يَشۡوِي ٱلۡوُجُوهَۚ | (الكهف : ٢٩) .

ئەڵێت : (ئاوێکی ڕەشە) .

٢٩ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت :

(ئەگەر سەتڵێک غَسَّاق بکرێت بە دنیادا، ئەوە ئەهلی دنیا بۆگەن ئەبوون).

٣٠ - مجاهد بن جبر دەربارەی : | فَلۡيَذُوقُوهُ حَمِيمٞ وَغَسَّاقٞ | (ص : ٥٧) .

ئەڵێت : (سەرمایەکە کە بەرگەی ناگیرێت) .

---

: سەنەدەکەی لاوازە

**٣١ - أبا هبيرة الزيادي** وتی :

گوێم لە عبداللە بن عمرو بن العاص بوو فەرمووی : (ئایا ئەزانن الغَسَّاق چییە ؟)

وتیان : اللہ أعلم .

فەرمووی : (کێم و زوخاوێکی توند و بەهێزە، ئەگەر یەک دڵۆپەی بڕژێنرێت لە ڕۆژئاوا، ئەهلی ڕۆژهەڵات بۆگەنی ئەبن، وە ئەگەر یەک دڵۆپەی بڕژێنرێت لە ڕۆژهەڵات، ئەهلی ڕۆژئاوا بۆگەنی ئەبن) .

**٣٢ - عون بن أبي شداد** ئەڵێت :

عبداللە بن عباس لە الحَطِیم دانیشتبوو، وتی : پەنا ئەگرم بە اللہ لە ئاگر - ی جەهەننەم -، ئەگەر قومێک لە غِسلین بهێنرێتە سەر زەوی، ئەوە - خەڵکی - ژیانیان لێ تاڵ ئەبوو) .

---

**: الحَطِیم شوێنێکە لە بەشی دەرەوەی کەعبە**

**٣٣ - الحسن البصري** دەربارەی : ﴿ تُسْقَىٰ مِنْ عَيْنٍ ءَانِيَةٍ ﴾ : لە کانیەکی زۆر گەرم ئاوی پێ ئەدرێت ﴿ **(الغاشِيَة : ٥)** .

ئەڵێت (ئەگەر شتێک زۆر گەرم بووایە و هیچ شتێکی تر لەو گەرم تر نەبوایە عەرەب پێی ئەوت : گەیشتووەتە ئەوپەڕی گەرمی، پاشان الله بارک و تعالی ئەمەی دابەزاند | تُسۡقَىٰ مِنۡ عَيۡنٍ ءَانِيَةٖ : لە کانیەکی زۆر گەرم ئاوی پێ ئەدرێت |، جا لە کاتی دروست بوونی جەهەننەمەوە بۆیان گەرم ئەکرێت، هەربۆیە زۆر گەرمە و گەشتووەتە ئەوپەڕی گەرمی) .

٣٤ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت :

(ئەگەر یەک دڵۆپە لە قەترانی جەهەننەم بکەوێتە سەر زەوی، زەوی و ئەوەشی تێیدایەتی ئەسووتێن) .

٣٥ - عبدالله بن عباس رضي الله عنه ئەڵێت :

(ئەگەر یەک دڵۆپەی زەقومی جەهەنەم بهێنرایەتە دنیاوە، ئەوە ژیانی خەڵکی تێکئەچوو) .

٣٦ - الحسن البصري ئەڵێت :

(هەموو ڕۆژێک ئاگر حەفتا هەزار جار ئەیانخوات، هەرجارێک کە ئەیانخوات ئەوترێت : ' وەکو خۆتان لێ بێتەوە '، جا ئەگەڕێنەوە بۆ شێوەکەی یەکەمجاریان) .

٣٧ - الحسن البصري وه قتادة بن دعامة لەبارەی ئایەتی ﴿سَأُرْهِقُهُ صَعُودًا﴾ (المُدَثِر : ١٧) .

ئەڵێن : (سزادانێک کە هیچ پشوو و ئیسراحەتێکی تێدا نییە) .

٣٨ - مجاهد بن جبر ئەڵێت :

(ئەهلی دۆزەخ تووشی گەڕ و گوڵی ئەبن، جا خۆیان ئەخورێنن هەتا ئێسکەکانیان دەرئەکەوێت، ئەڵێت : ' ئەمە بەهۆی چیەوە تووشمان بوو؟ ' .

ئەوترێت : ' بەو ئازارەی تووشی ئیمانداارانتان ئەکرد ' ) .

٣٩ - سلمان الفارسي رضي الله عنه ئەفەرمووێت :

(پردی صراط ئەهێنرێت، تیژیەکەی وەکو تیژی مووس وایە، مەلائیکەکان ئەڵێن : ' ئەی پەروەردگارمان جا کێ ئەتوانێت بەسەر ئەمەدا تێبەپەڕێت؟! ' .

ئەفەرمووێت : ' هەرکەسێک من بمەوێت لە دروستکراوەکانم ' .

ئەڵێن : ' ئەی پەروەردگارمان بەو شێوەیەی شایەنتە نەمانپەرستوویت ' ) .

٤٠ - عبدالله بن سلام رضي الله عنه ئەفەرمووێت :

(بەڕێزترین دروستکراوی الله لەلای الله تعالى أبو القاسم ە ﷺ، وە بەهەشت لە ئاسمانە، وە جەهەننەم لە زەویە، کاتێک قیامەت دێت الله هەموو دروستکراوەکان ئوممەت بە ئوممەت و پێغەمبەر بە پێغەمبەر کۆئەکاتەوە،

هەتا أحمد ﷺ خۆی و ئوممەتەکەی لە کۆتاییەکان ئەبن، پاشان پردێک لەسەر جەهەننەم دائەنرێت و بانگکەرێک بانگ ئەکات : (أحمد و ئوممەتەکەی لە کوێن؟)، خۆی هەڵئەستێت و ئوممەتەکەی شوێنی ئەکەون بە باش و خراپیانەوە، الله لێڵی و نابینایی ئەهێنێت بەسەرچاوی دوژمنەکانیدا، هەربۆیە لە ڕاست و چەپەوە ئەکەونە ناوی، پێغەمبەر ﷺ ئەڕوات و پیاوچاکانیشی لەگەڵدایە، مەلائیکەکان پێیان ئەگەن و ئەیانبەنە شوێنەکانیان لە بەهەشت لەلای ڕاست و چەپەوە، هەتا - **رسول الله** ﷺ - ئەگات بە پەروەردگاری تبارک وتعالی، کورسیەکەی بۆ دائەنرێت لەلای ڕاستی الله تبارک و تعالی، پاشان بانگکەرێک بانگ ئەکات : (عیسا و ئوممەتەکەی لە کوێن؟)، خۆی هەڵئەستێت و ئوممەتەکەی شوێنی ئەکەون بە باش و خراپیانەوە، الله لێڵی و نابینایی ئەهێنێت بەسەرچاوی دوژمنەکانیدا، هەربۆیە لە ڕاست و چەپەوە ئەکەونە ناوی، وە پێغەمبەر ﷺ نەجاتی ئەبێت و پیاوچاکانیش لەگەڵی، مەلائیکەکان پێیان ئەگەن و ئەیانبەنە شوێنەکانیان کە بەهەشت لەلای ڕاست و چەپەوە، هەتا - **عیسی** ﷺ - ئەگات بە پەروەردگاری تبارک وتعالی، کورسیەکەی بۆ دائەنرێت لە لاکەی تری الله تبارک و تعالی، پاشان پێغەمبەرەکان و ئوممەتەکان بەدوایاندا دێن هەتا کۆتاییەکەیان کە نوح ـە علیە السلام) .

٤١ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت :

(مرۆڤی دووڕوو و ئیماندار نووریان پێ ئەدرێت، وە تاریکیەک دادێت، پاشان ئەڕۆن بەسەر پردی جەهەننەم ـدا - **صراط** - وە دووڕووەکانیشیان لەگەڵدایە، قولاپ و دڕکی پێوەیە، الله ویستی لەسەر هەر کەسێک بێت ئەیگرن، پاشان ڕووناکی دووڕووەکە ئەکوژێتەوە و ئیماندارەکە ڕزگاری ئەبێت، یەکەم کۆمەڵە کە ڕزگاریان ئەبێت دەموچاویان وەکو مانگی چواردە وایە، حەفتا هەزارن، لێپرسینەوەیان لەگەڵدا ناکرێت، پاشان ئەوانەی لەدوای ئەوان دێن - **دەموچاویان** - وەکو ڕووناکترین ئەستێرە وایە لە ئاسماندا، پاشان بەو شێوەیە هەتا شەفاعەت ڕێگەی پێ ئەدرێت و شەفاعەت ئەکەن) .

٤٢ - سالم بن أبي الجعد ئەڵێت :

(لەسەر ئاگر - واتە جەهەننەم - سێ پردی لێیە، پردێک ئەمانەتی لەسەرە، هیچ کەسانێک لە بەزایەدەرانی ئەمانەت بەسەریدا ناڕۆن ئیللا ئەڵێت ' ئەی پەروەردگارم ئەمە بە فیڕۆیدام '، وە پردێک ڕەحمی لەسەرە، هیچ کەسانێک لە وانەی سیلەی ڕەحمیان پچڕاندووە بەسەریدا ناڕۆن ئیللا ئەڵێت ' ئەی پەروەدگارم ئەمە منی پچڕاند' ، وە لە پردێک الله تبارک و تعالى لە بۆسە و کەمیندایە) .

٤٣ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت :

(لەسەر جەهەننەم پردێکی تێدایە پیاو خێراتر لە هەورەتریشقە و با و باڵندە بەسەریدا تێئەپەڕێت) .

٤٤ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت :

(پردی صراط لەسەر جەهەننەمە، ئەملا و ئەولای دڕک و قولاپی زۆری پێوەیە، الله هەرکەسێکی بووێت لە مونافیقەکان پێیان ئەگرێت، وە لەو ڕۆژەدا مونافیقەکان لەگەڵ ئیماندارەکاندان، بە هەر یەکێک لە ئیماندار و مونافیقەکان ڕووناکیەک ئەدرێت تا لەسەر پردی صراط ڕێی پێ بکەن، کاتێک تاریکیان بەسەردا دێت ڕووناکی مونافیقەکان ئەکوژرێنرێتەوە، وە ڕووناکی ئیمانداران شەوق ئەداتەوە هەتا ئەڕۆنە بەهەشتەوە ...) .

٤٥ - عبدالله بن مسعود رضي الله عنه دەربارەی ئایەتی : ﴿وَإِن مِّنكُمۡ إِلَّا وَارِدُهَاۚ﴾ : هەمووتان ئەبێت پێی بگەن ﴿ (مريم : ٧١) .

ئەفەرمووێت : (پردی صراط) .

٤٦ - عبدالله بن عباس رضي الله عنه ئەفەرمووێت :

(کاتێک قیامەت هات جنۆکە و مرۆڤەکان لەسەر یەک تەختایی کۆ ئەکرێنەوە، یەکتری ناناسن، جنۆکە و مرۆڤەکان دە بەشن، جنۆکەکان نۆ بەشن، وە مرۆڤەکان تەنها یەک بەشن، پاشان ئاسمانی دنیا لەت ئەبێت و پۆل

پۆل مەلائیکە دێنە خوارەوە، لە بەشی پێشەوەی هەر ڕیزێک سەرێک هەیە، ئەهلی زەوی پێیان ئەڵێن ' ئایا پەروەردگاری ئێمە لەگەڵ ئێوەدایە؟ ' .

ئەڵێن ' نەخێر لەگەڵماندا نییە، بەڵکو دێت ' .

ئەهلی ئاسمانی دنیا و جنۆکە و مرۆڤەکان ئەبن بە دە بەش، ئەهلی ئاسمانی دنیا ئەبن بە نۆ بەش، وە جنۆکە و مرۆڤەکان ئەبن بە یەک بەش، پاشان ئاسمانی دووەم لەت ئەبێت، مەلائیکەکان پۆل پۆل دێنە خوارەوە، لە بەشی پێشەوەی هەر ڕیزێک سەرێک هەیە، ئەهلی زەوی پێیان ئەڵێن ' ئایا پەروەردگاری ئێمە لەگەڵ ئێوەدایە؟ ' .

ئەڵێن ' نەخێر لەگەڵماندا نییە، بەڵکو دێت ' .

پاشان ئەهلی ئاسمانی دووەم و ئەهلی ئاسمانی دنیا و جنۆکە و مرۆڤەکان ئەبن بە دە بەشەوە، ئەهلی ئاسمانی دووەم نۆ بەشن، وە ئەهلی ئاسمانی دنیا و جنۆکە و مرۆڤەکان تەنها یەک بەشن .

پاشان ئاسمانی سێیەم لەت ئەبێت، مەلائیکەکان پۆل پۆل دێنە خوارەوە، لە بەشی پێشەوەی هەر ڕیزێک سەرێک هەیە، ئەهلی زەوی پێیان ئەڵێن ' ئایا پەروەردگاری ئێمە لەگەڵ ئێوەدایە؟ ' .

ئەڵێن ' نەخێر لەگەڵماندا نییە، بەڵکو دێت ' .

پاشان ئەهلی ئاسمانی سێیەم و ئاسمانەکانی دیکەی ژێر خۆی و جنۆکە و مرۆڤەکان ئەبن بە دە بەش، ئەهلی ئاسمانی سێیەم نۆ بەشن، وە ئەهلی ئاسمانەکانی دیکەی ژێر خۆی و جنۆکە و مرۆڤەکان تەنها یەک بەشن، پاشان ئەهلی ئاسمانەکان بەم جۆرە دێن هەتا ئەگات بە ئاسمانی حەوتم، هەتا ئەگاتە ئەوەی پەروەردگارت بەسەر هەورێکی تەنکەوە دێت و مەلائیکەکانیش پۆل پۆل دێن و بێدەنگن .

---

**: ئەڤەرەکە والله أعلم باسی ئەم ئایەتە ئەکات | هَلْ يَنْظُرُونَ إِلَّا أَنْ يَأْتِيَهُمُ اللَّهُ فِي ظُلَلٍ مِنَ الْغَمَامِ وَالْمَلَائِكَةُ وَقُضِيَ الْأَمْرُ ۚ وَإِلَى اللَّهِ تُرْجَعُ الْأُمُورُ | (البقرة : ٢١٠)**

٤٦ - أبو الزبير پرسیاری لە جابر بن عبدالله کرد دەربارەی هاتنی پەروەردگار ؟

جابر وتی : گوێم لە رسول الله ﷺ بوو فەرمووی : (ئێمە لە قیامەتدا لەسەر دۆڵێکین لە سەرو خەڵکیەوە، ئوممەتەکان بەناوی بتەکان و ئەوانەی ئەیانپەرست بانگ ئەکرێن لە یەکەمیانەوە هەتا پەروەردگارمان دێت بۆلامان و ئەفەرمووێت : ' چاوەڕێی چی ئەکەن ؟ ' .

ئەڵێن : ' چاوەڕێی پەروەردگارمان ئەکەین عز وجل ' .

ئەفەرمووێت : ' من پەروەردگارتانم ' .

ئەڵێن : ' ڕێگەمان بدە بتبینین '، جا بۆیان دەرئەکەوێت بە پێکەنینەوە .

جابر ئەڵێت : گوێم لە رسول الله ﷺ بوو و فەرمووی : ' جا ئەڕوات و ئەوانیش شوێنی ئەکەون ' ) .

٤٧ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت :

(لە قیامەتدا هەر قەومێک هەر شتێکیان لە غەیری الله پەرستبێت بۆیان ئەهێنرێتە بەردەمیان، هەر کەسێک خۆر یان مانگ یان بتێکی پەرستبێت شوێنی ئەکەون هەتا ئەکەونە ناو ئاگر، پاشان سەرەی یەهودیەکان دێت، پێیان ئەوترێت : چیتان ئەپەرست؟

ئەڵێن : (الله و عزیز مان ئەپەرست) تەنها کەمێکیان نەبێت، پاشان پێیان ئەوترێت : (بەڕێکەون) .

پاشان سەرەی نەسرانیەکان دێت، پێیان ئەوترێت : چیتان ئەپەرست؟

ئەڵێن : (الله و عیسی مان ئەپەرست) تەنها کەمێکیان نەبێت، پاشان پێیان ئەوترێت : (بەڕێکەون) .

پاشان ئێمە لەسەر بەرزاییەکین و پەروەردگارمان عز وجل دێت و ئەفەرمووێت : (چاوەڕێی کێ ئەکەن؟) .

ئەڵێن : (پەروەردگارمان) .

پێیان ئەوترێت : (ئایا پەروەردگارتان ئەناسنەوە لەکاتێکدا نەتانبینیوە؟) .

ئەڵێن : (بەڵێ ئەیناسینەوە، هیچ هاوشێوەیەکی نییە)، جا لەوکاتەدا پەروەردگارمان بە پێکەنینەوە بۆمان دەرئەکەوێت، پاشان شوێن پەروەردگارمان ئەکەوین و ئەمانبات بۆ لای پردی صراط) .

٤٨ - أبي رزين رضي الله عنه وتی :

(ئەی رسول الله ئایا هەمووماں لە قیامەتدا پەروەردگارمان ئەبینین؟ وە نمونەی ئەوە چییە لە دروستکراوەکانیدا؟

فەرمووی ﷺ : (ئایا هەمووتان مانگ نابینن ئەگەر بە تەنها لە ئاسماندا بێت؟).

وتم : بەڵێ .

فەرمووی ﷺ : (جا الله گەورەترە) .

٤٩ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت :

(ئێوە پەروەردگارتان عز وجل ئەبینن، هیچ ئاستەنگیەکیان نایەتە پێش لە بینینیدا، وەک چۆن تەماشای مانگی چواردە ئەکەن لە شەودا) .

٥٠ - عقبة بن عامر الجهني ئەڵێت :

(ئەوانەی سەرەتا و کۆتایی لە دەشتاییەکدا کۆئەکرێنەوە، پاشان خاوەنی عیززەت - واتە الله تعالى - خۆی دەرئەخات بۆیان) .

٥١ - حذيفة بن اليمان رضي الله عنه ئەڵێت :

(بانگی محمد ﷺ ئەکرێت، ئەویش ئەفەرمووێت ' لَبَّيْكَ وَ سَعْدَيْكَ وَ اَلْخَيْرُ فِي يَدَيْكَ وَ اَلشَّرُّ لَيْسَ إِلَيْكَ وَ اَلْمَهْدِيُّ مَنْ هَدَيْتَ عَبْدُكَ وَ اِبْنُ عَبْدَيْكَ مِنْكَ وَ بِكَ وَ إِلَيْكَ لاَ مَلْجَأَ وَ لاَ مَنْجَى وَ لاَ مَفَرَّ مِنْكَ إِلاَّ إِلَيْكَ سُبْحَانَكَ وَ حَنَانَيْكَ سُبْحَانَكَ رَبَّ اَلْبَيْتِ '، ئەوەش مقامی محمود ە) .

٥٢ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت :

(ئەڵێن : ئایا کەسێک ئەناسن شەفاعەتمان بۆ بکات لەلای پەروەردگارمان هەتا ڕزگارمان ببێت لە ناخۆشی و خەم و ناڕەحەتی ئەم ڕۆژە؟) .

جا ئەڵێن : (کەس ناناسین هێندەی آدم بەڕێز بێت لەلای الله، بە دەستی خۆی دروستی کردووە، وە ڕۆحێکی لەلایەن خۆیەوە بەبەردا کردووە، وە فەرمانی بە فریشتەکان کردووە و سوجدەیان بۆ بردووە)، جا دێن بۆ لای ئادەم علیه السلام و ئەڵێن : (ئەی آدم، شەفاعەتمان بۆ بکە لەلای پەروەردگارت عز وجل هەتا ڕزگارمان ببێت لە ناخۆشی و خەم و ناڕەحەتی ئەم ڕۆژە) .

ئەفەرمووێت : (من بۆ ئەوە نیم)، وە باسی هەڵەکەی ئەکات، (بەڵام بڕۆن بۆلای نوح علیه السلام، ئەو یەکەمین پێغەمبەرە) .

جا ئەچن بۆ لای نوح علیه السلام و ئەفەرمووێت : (من بۆ ئەوە نیم، بەڵام بڕۆن بۆ لای إبراهیم، ئەوەی الله کردوویەتی بە خۆشەویستی خۆی) .

پاشان ئەچن بۆ لای إبراهیم علیه السلام و ئەفەرمووێت : (من بۆ ئەوە نیم، بەڵام بڕۆن بۆ لای موسی، ئەوەی الله بە قسەکردن قسەی لەگەڵ کردووە).

دواتر ئەچن بۆ لای موسی و ئەفەرمووێت : (من بۆ ئەوە نیم، بەڵام بڕۆن بۆ لای عیسی) .

جا ئەچن بۆ لای عیسی و ئەفەرمووێت : (من بۆ ئەوە نیم) .

جا ئەگەڕێنەوە بۆ لای آدم و ئەڵێن : (ئەی باوکمان، هیچ کەسێکمان نەبینیەوە تا شەفاعەتمان بۆ بکات لەلای پەروەردگارمان عز وجل) .

جا ئەفەرمووێت : (ئەی منداڵەکانم، ئایا ئەگەر کەسێکتان توورەکەیەک بهێنێت و کەلوپەلەکانی خۆیی تێ بکات، پاشان گرێ لە سەری تورەکەکە بدات ئایا هیچ کەسێک ئەتوانێت بگات بە کەلوپەلەکان هەتا گرێیەکە نەکاتەوە؟)

ئەڵێن : (نەخێر) .

جا ئەفەرمووێت : (بەڕاستی محمد کۆتایی پێغەمبەرانە، بڕۆن بۆ لای تا شەفاعەتتان بۆ بکات لەلای پەروەردگارتان عز وجل) .

جا خەڵکی دێن بۆ لام و ئەڵێن : (ئەی محمد، ئەمە مقام المحمود ە، شەفاعەتمان بۆ بکە لەلای پەروەردگارت هەتا ڕزگارمان بکات لە درێژی و خەم و خەفەت و ناخۆشی ئەم ڕۆژە) .

جا ئەڵێم من بۆ ئەوەم، پاشان ئەڕۆم هەتا ئەگەم بە دەرگای بەهەشت، جا دەسکەکەی ئەگرم هەتا بۆم بکرێتەوە .

پەروەردگارم ئەفەرمووێت : (بیکەنەوە بۆ بەندەکەم أحمد) .

پاشان دەرگاکەم بۆ ئەکرێتەوە، ئەڕۆمە بەهەشتەوە و پەروەردگارم دانیشتووە لە بەهەشتەکەی لەسەر کورسیەکەی، جا سوجدەی بۆ ئەبەم، پاشان الله کۆمەڵە شوکرانەبژێریەکم فێر ئەکات کە هیچ کەسێک پێش من بەو شێوەیە شوکرانەبژێری نەکردووە .

پاشان پێم ئەڵێت : (ئەی محمد، سەرت بەرز بکەرەوە، قسە بکە گوێت لێ ئەگیرێت، وە داوا بکە پێت ئەدرێت، وە شەفاعەت بکە شەفاعەتەکەت وەرئەگیرێت) .

منیش سەرم بەرز ئەکەمەوە و ئەڵێم ئەی پەروەردگارم، ئوممەتەکەم، جا الله کۆمەڵەیەکم بۆ دیاری ئەکات، پاشان سوجدە ئەبەمەوە، دواتر ئەفەرمووێت : (ئەی محمد، سەرت بەرز بکەرەوە، قسە بکە گوێت لێ ئەگیرێت، وە داوا بکە پێت ئەدرێت، وە شەفاعەت بکە شەفاعەتەکەت وەرئەگیرێت)، جا سەرم بەرز ئەکەمەوە و ئەڵێم ئەی پەروەردگارم ئوممەتەکەم، ئوممەتەکەم، جا الله کۆمەڵەیەکم بۆ دیاری ئەکات پاشان مۆڵەتم پێ ئەدرێت بە شەفاعەت کردن) .

٥٣ - عبدالله بن عمر رضي الله عنهما ئەفەرمووێت :

(لە ڕۆژی قیامەتدا خەڵکی ئەبنەوە بە جەستە و هەموو کۆمەڵەیەک شوێن پێغەمبەرەکەیان ئەکەون و ئەڵێن : ئەی فڵان، شەفاعەتمان بۆ بکە، ئەی فڵان شەفاعەتمان بۆ بکە، هەتا شەفاعەتەکە ئەگات بە محمد ﷺ، ئەوەش مقام ی محمود ە) .

٥٤ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت :

(لە ڕۆژی قیامەتدا خەڵکی کۆ ئەکرێنەوە، خەم و خەفەت دایان ئەگرێت، وە ئەڵێن : ' بریا داوامان لە کەسێک کردبایە هەتا لەم شوێنە نەجاتمان بووایە '، جا دێن بۆلای آدەم و ئەڵێن : ' ئەی آدم، تۆ ئەو کەسەیت الله دروستی کردوویت بە دەستی، وە ڕۆحێکی لەلایەن خۆیەوە بەبەردا کردوویت، وە فەرمانی کردووە بە فریشتەکان سوجدەیان بۆ بردوویت، شەفاعەتمان بۆ بکە لەلای پەروەردگارت عز وجل تا نەجاتمان بدات لەم شوێنەمان '، ئەفەرمووێت : ' من بۆ ئەوە نیم '، وە باسی هەڵەکەی ئەکات وە بەهۆیەوە شەرم ئەکات لە پەروەردگاری عز وجل، ' بەڵام بڕۆن بۆلای نوح، یەکەم پێغەمبەرە کە الله ناردوویەتی '، جا ئەچن بۆ لای نوح و ئەفەرمووێت : ' من بۆ ئەوە نیم '، وە باسی هەڵەکەی ئەکات وە بەهۆیەوە شەرم ئەکات لە پەروەردگاری عز وجل، ' بەڵام بڕۆن بۆلای إبراهیم، ئەوەی الله کردوویەتی بە خۆشەویستی خۆی '، پاشان باسی موسی و عیسی ی کرد، ئەڵێن : ' من بۆ ئەوە نیم، بەڵام بڕۆن بۆلای محمد

ﷺ، بەندەیەک کە الله لە تاوانی پێشوو و داهاتووی خۆش بووە '، جا دێن بۆ لام، داوای مۆڵەت بۆ چوونەلای پەروەردگارم ئەکەم، جا مۆڵەتم پێ ئەدرێت، هەر کە بینیم سوجدە ئەبەم) .

**٥٥ - رسول الله** ﷺ ئەفەرمووێت :

(ئەگەر هەر حەوت ئاسمان و زەویەکە لە لایەک بن - لای تەرازوو -، وە لا إله إلا الله ش لەلایەک، ئەوە لا إلە إلا الله قورس ترە) .

---

: مەبەستی لە ذیکری لا إله إلا الله یە، والله أعلم .

**٥٦ - سلمان الفارسي** رضي الله عنه ئەفەرمووێت :

(لە ڕۆژی قیامەتدا تەرازوو ئەهێنرێت، ئەگەر ئاسمانەکان و زەوی و هەموو ئەوەی تێیاندایە بخرێنە لایەکی ئەوە جێگەی ئەبێتەوە .

مەلائیکەکان ئەڵێن : ئەی پەروەردگارمان، چ شتێک ئەکێشیت بەمە؟

ئەفەرمووێت : هەر شتێک بمەوێت لە دروستکراوەکانم .

مەلائیکەکان ئەڵێن : ئەی پەروەردگارمان، بەو شێوەیەی شایەنتە نەمانپەرستوویت) .

٥٧ - الشعبي ئەڵێت :

(عائشة وتی : ئەی رسول الله، ئایا ڕۆژی قیامەت یەکتری ئەناسینەوە؟ چونکە من ئەمەم بیستووە ﴿ فَإِذَا نُفِخَ فِى ٱلصُّورِ فَلَآ أَنسَابَ بَيْنَهُمْ يَوْمَئِذٍ وَلَا يَتَسَآءَلُونَ ﴾ (المؤمنون : ١٠١) .

رسول الله ﷺ فەرمووی : (لە سێ شوێندا هەموو کەسێک کەسەکانی دیکەی بیرئەچێتەوە :

کاتێک نامەی کردەوەکان ئەدرێت بە هەموو کەسێک هەتا ئەبینێت بە دەستەڕاستی وەری ئەگرێت یان بە چەپ .

وە لە کاتی کێشانەدا هەتا ئەبینێت قورس ئەبێت یان سووک .

وە لەسەر پردی صراط، خەڵکی خێراتر لە هەورەتریشقە و با و باڵندە بەسەریدا تێئەپەڕن) .

٥٨ - عبيد بن عمير ئەڵێت :

(لە ڕۆژی قیامەتدا پیاوی گەورەی باڵابەرز ئەهێنرێت، پاشان دائەنرێت لەسەر لایەکی تەرازوو، جا لەلای الله عز وجل قورسایی باڵە مێشێکی نییە : ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمْ وَلِقَآئِهِۦ فَحَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ فَلَا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَزْنًا ﴾ (الكهف : ١٠٥) .

٥٩ - كعب بن عجرة ئەڵێت :

(لە ڕۆژی قیامەتدا پیاو ئەهێنرێت پاشان ئەکێشرێت بە دەنکە تۆوێک، جا هێندەی دەنکە تۆوەکە قورسایی نییە، وە ئەکێشرێت بە باڵە مێشوولەیەک، هێندەی باڵە مێشوولەکە قورسایی نییە، | فَلَا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَزْنًا | (الكهف : ١٠٥)

٦٠ - حميد بن هلال ئەڵێت :

(بۆمان باسکراوە کە لە ڕۆژی قیامەتدا پیاو بانگ ئەکرێت بۆ لێپرسینەوە، پێی ئەوترێت ' ئەی فلانی کوڕی فلان، وەرە بۆ لێپرسینەوە '، هەتا کەسەکە ئەڵێت ' ئەوە تەنها مەبەستیان لە منە بۆ لێپرسینەوە ' ) .

---

: واتە هەرکاتێک کەسێک بانگ بکەن ئەزانێت مەبەستیان لەوە، وەک لە ئەثەری دواتردا ڕوونکراوەتەوە .

٦١ - طلحة بن عمرو ئەڵێت :

(عطاء پێی ئەوتم ' ئەی طلحة چەندە هاوشێوەی ناوی من و تۆ زۆرە! لە ڕۆژی قیامەتدا کاتێک وترا ' فلان کەس، بێجگە ئەو کەس هەڵنەستێت ' هیچ کەسێک هەڵناستێت بێجگە لە کەسی مەبەست) .

٦٢ - أبي الجوزاء ئەم ئايەتەی خوێندەوە : | وَيَخَافُونَ سُوٓءَ ٱلۡحِسَابِ | (الرَّعد : ٢١) .

پاشان وتی : (لێپرسینەوە لەسەر کار و کردەوەکان) .

٦٣ - إبراهيم النخعي دەربارەی ئايەتی : | أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ سُوٓءُ ٱلۡحِسَابِ | (الرَّعد : ١٨) .

ئەڵێت : (هیچ چاکەیەکیان لێ وەرناگیرێت، وە لە هیچ تاوانێکیان نابووردرێت) .

٦٤ - الفضيل بن مرزوق لە أبي إسحاق السبيعي ەوە لە عبدالله بن عطاء ەوە کە عامر الجهني ئەڵێت : (خاوەن شکۆمەندی و عیززەت - واتە الله تعالى - دەرئەکەوێت و سێ جار ئەفەرمووێت ' ئەمڕۆ هەمووان ئەزانن گەورەیی بۆ کێیە، با ئەوانە هەستن کە | تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمۡ عَنِ ٱلۡمَضَاجِعِ يَدۡعُونَ رَبَّهُمۡ خَوۡفٗا وَطَمَعٗا وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ | (السَّجدَة : ١٦) ' .

جا ئەوانە هەڵدەستن .

پاشان سێ جار ئەفەرمووێت ' ئەمڕۆ هەمووان ئەزانن گەورەیی بۆ کێیە، با ئەوانە هەستن کە | لَّا تُلۡهِيهِمۡ تِجَٰرَةٞ وَلَا بَيۡعٌ عَن ذِكۡرِ ٱللَّهِ وَإِقَامِ ٱلصَّلَوٰةِ وَإِيتَآءِ ٱلزَّكَوٰةِ يَخَافُونَ يَوۡمٗا تَتَقَلَّبُ فِيهِ ٱلۡقُلُوبُ وَٱلۡأَبۡصَٰرُ | (النُّورِ : ٣٧) .

جا ئەوانە هەڵدەستن .

پاشان سێ جار ئەفەرمووێت ' ئەمڕۆ هەمووان ئەزانن گەورەیی بۆ کێیە، با حَمَّادون ەکان هەستن ' .

الفضيل ئەڵێت : ' پرسیارم کرد لە أبو إسحاق حَمَّادون ەکان کێن؟ ' .

وتی : ' ئوممەتی محمد ﷺ ' ) .

**٦٥ - الحسن البصري** ئەڵێت :

(کاتێک ئوممەتەکان ئەهنێرێن بۆ بەردەم رب العالمين لە ڕۆژی قیامەتدا، بانگیان لێ ئەکرێت : (با ئەوە هەستێت کە پاداشتی لەسەر الله یە)، جا تەنها ئەوانە هەڵئەستن کە لە دنیادا لێبووردە بوون) .

**٦٦ - رسول الله** ﷺ ئەفەرمووێت :

(الله عز وجل لە ڕۆژی قیامەتدا ئەفەرمووێت : ' ئەی نەوەی ئادەم، ئایا نەمخستیتە سەر هێستر و حوشتر؟ وە ژنم لێ مارە نەکردیت؟ وە نەمکردیت بە سەر گەورە و چواریەکی غەنیمە ببەیت ' ؟

ئەڵێت : بەڵێ وابوو .

الله تعالى ئەفەرمووێت : ' ئەی شوکرانەبژێریەکەت کوا بۆی؟ ' ) .

---

**: (چواریەکی غەنیمە ببەیت) لە جاهیلیەتدا سەرگەورەی هۆزێک چواریەکی غەنیمەتی پێدراوە .**

٦٧ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت :

(ئەوترێت بە كافر : ئەگەر پڕ بە زەوی ئاڵتوونت هەبێت، ئەیكەیت بە بریتی بۆ دەرچوونت لێرە؟ - واتە جەهەننەم -

ئەڵێت : بەڵێ .

ئەوترێت : درۆت كرد، كەمتر لەوەت داوا لێكرا بەڵام نەتكرد، لا إله إلا الله).

---

: واتە داوای ئەوەت لێكرا تەنها الله تعالى بپەرستیت و شەریكی بۆ دانەنێیت و كافر نەبیت پێی، بەڵام وا نەبوویت .

٦٨ – پێغەمبەر ﷺ ئەفەرمووێت :

(لە ڕۆژی قیامەتدا كەسێكی ئەهلی بەهەشت ئەهێنرێت، پێی ئەوترێت ' شوێنەكەت بەلاوە چۆنە؟ '

ئەڵێت : ' باشترین و چاكترین شوێنە '

پێ ئەفەرمووێت - واتە الله تعالى - : ' داوا بكە و هیوا بخوازە '

ئەڵێت : ' تەنها داوا و هیوام ئەوەیە بمگێڕیتەوە بۆ دنیا لە پێناوتدا دە جار بكوژرێم ' .

وه كەسێكی ئەهلی جەهەننەم ئەهێنرێت، پێی ئەوترێت ' ئەی بەنی ئادەم شوێنەكەت بەلاوە چۆنە؟ '

ئەڵێت : ' خراپترین شوێنە '

پێ ئەفەرمووێت - واتە الله تعالى - : ' پڕی زەوی زێڕ لە بریتی ئەدەیت؟ '

ئەڵێت : ' بەڵێ ' .

ئەفەرمووێت : ' درۆ ئەكەیت، كەمتر و ئاسانتر لەوە داوات لێكرا ' .

**٦٩** - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت :

(لە رۆژی قیامەتدا كەسێک ئەهێنن كە لە دنیادا بە خۆشترین شێواز ژیاوە و زۆرترین نیعمەتی پێدراوە .

- الله تعالى - ئەفەرمووێت : (یەک جار هەڵی بكێشن لە جەهەننەم) .

پاشان ئەهێنرێتەوە، پاشان - الله تعالى - ئەفەرمووێت : (ئەی بەنی ئادەم ئایا هەرگیز نیعمەتت پێدرابوو لە دنیا؟ ئایا هەرگیز شتانێكت بینی كە دڵت پێی خۆش بێت؟ ئایا هەرگیز هیچ خۆشیەكت بینی؟)

ئەڵێت : نەخێر سوێند بە عیززەتت، هەرگیز هیچ خۆشیەكم نەبینیوە، وە هەرگیز هیچ شتێكم نەبینیوە دڵمی پێ بكرێتەوە .

پاشان - الله تعالى - ئەفەرمووێت : (بیگەڕێننەوە - واتە بۆ جەهەننەم - ) .

وە کەسێک ئەهێنرێت کە لە دنیادا لە بەڵا و ناخۆشیدا بووە، زۆر ماندوو بووە و زیانی پێگەیشتووە .

- الله تعالى - ئەفەرمووێت : (یەک جار بیبەنە ناو بەهەشتەوە) .

پاشان - الله تعالى - ئەفەرمووێت : (ئەی بەنی ئادەم ئایا هەرگیز لە ژیاندا تووشی شتێک بوویت کە ڕقت لێی بێت و بەلاتەوە ناخۆش بێت؟) .

ئەڵێت : نەخێر سوێند بە عیززەتت، هەرگیز لە دنیایدا هیچ شتێکم نەبینیوە پێم ناخۆش بێت) .

٧٠ - شقيق بن سلمة ئەڵێت :

(الله لە ڕۆژی قیامەتدا بەندە بانگ ئەکات، ئینجا بە دەستی دای ئەپۆشێت، پاشان پێی ئەفەرمووێت : (ئەوەت لەبیرە؟ - واتە تاوانەکانی بیر ئەخاتەوە -

بەندەکەش ئەڵێت : بەڵێ ئەی پەروەردگارم .

پێی ئەفەرمووێت : لەو تاوانەت خۆش بووم) .

٧١ - أبو موسى الأشعري رضي الله عنه ئەفەرمووێت :

(کە ڕۆژی قیامەت هات نامەی کردەوەی ئیماندار ئەدرێتەوە لە نێوان خۆی و پەروەردگاریدا، الله عز وجل دانی پێ ئەنێت بە تاوانەکانیدا، پێی ئەفەرمووێت : (ئەی بەندەکەم، فڵانە و فڵانە تاوانت ئەنجام دا) .

ئەویش ئەڵێت : (بەڵێ) .

جا الله لێی خۆش ئەبێت و بۆی ئەگۆڕێت بە چاکە، ئەوەش ئەو کاتە ئەڵێت : ﴿ هَآؤُمُ ٱقۡرَءُواْ كِتَٰبِيَهۡ ﴾ (**الحاقَّة** : ١٩) ئاواتەخوازە دانیشتوانی زەوی هەموو سەیری نامەی کردەوەکانی بکەن .

وە مونافیق نامەی کردەوەکانی پێ ئەدرێتەوە .

الله پێی ئەفەرمووێت : (ئەی بەندەکەم فڵانە و فڵانە تاوانت ئەنجام دا) .

ئەڵێت : (سوێند بە عیززەتت نەمکردووە) .

پێی ئەفەرمووێت : (بەڵکو فڵان کارت کرد لە فڵان کاتدا) .

ئەڵێت : (نەخێر سوێند بە عیززەتت، ئەوەی لەسەرم نووسراوە درۆیە) .

پێی ئەفەرمووێت : (ئایا فڵانە کارت ئەنجام داوە؟) .

ئەڵێت : (نەخێر) .

پێی ئەفەرمووێت : (بەڵێ بەڵکو فڵانە کارت کرد لە فڵانە ڕۆژدا وە لە فڵانە کاتدا) .

ئەڵێت : (نەخێر بە عیززەتت وا نییە) .

جا لەو کاتەدا مۆر لە دەمی ئەدرێت، جا یەکەم شت ڕانی ڕاستی دەست ئەکات بە قسەکردن) .

**٧٢ - أبي رافع** ئەڵێت :

(پێمان گەیشتووە کە لە قیامەتدا سێ کتێب ئەهێنرێت بۆ بەنی ئادەم، کتێبێک نیعمەتەکانی تێدایە، کتێبێک لێپرسینەوەی تێدایە، وە کتێبێکیش تاوانەکانی تێدایە، جا بە بچووکترین نیعمەتیان ئەوترێت : بڕۆ بەهاکەی خۆت ببە لە لێپرسینەوە، جا هێندەی هەموو کار و کردەوەی ئەبێت، تاوانەکان و نیعمەتەکانی وەکو خۆی ئەمێننەوە، دواى ئەوە بەندە ئەڵێت : ﴿ **إِنَّ رَبَّنَا لَغَفُورٌ شَكُورٌ** ﴾ (**فَاطِر : ٣٤**) .

**٧٣ - رسول الله** ﷺ ئەفەرمووێت :

(لە ڕۆژی قیامەتدا کافر ئەناسرێتەوە بە کار و کردەوەکانی، جا ڕەتی ئەکاتەوە و دەمە دەمێ ئەکات، پێی ئەوترێت : (ئەوانە دراوسێکەتن شایەتیت لەسەر ئەدەن) .

ئەڵێت : درۆ ئەکەن .

پێی ئەوترێت : (ئەی بنەماڵە و هۆزەکەت چی؟)

ئەڵێت : درۆ ئەکەن .

پێیان ئەوترێت - واتە بە کافرەکان - : (سوێند بخۆن) .

جا سوێند ئەخۆن، پاشان الله بێدەنگیان ئەکات، دواتر زمانیان ئەبێت بە شایەت بەسەریانەوە، دواى ئەوە ئەیانکاتە ناو جەهەننەمەوە) .

٧٤ - عبدالله بن عكيم ئەڵێت :

گوێم لە أبا مسعود بوو پێش قسەکردن سوێندی خوارد و وتی : (سوێند بە الله، هیچ کەسێکتان نییە ئیللا لە ڕۆژی قیامەتدا بە تەنها ئەبێت لەگەڵ الله عز وجل وەک بەتەنیا بوونتان لەگەڵ مانگی چواردەدا، پێی ئەفەرمووێت : ئەی بەنی ئادەم چی وای لێ کردیت لووتبەرزبیت بەرامبەرم؟ ئەی بەنی ئادەم چیت کرد بەوەی کە زانیت؟ ئەی بەنی ئادەم چیت وەڵامی پێغەمبەران دایەوە؟) .

٧٥ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت :

(سوێند بەوەی کە نەفسی منی بەدەستە، ئەهلی بەهەشت - لەوانەی چوونەتە ناو ئاگر - لە جەهەننەم دەرئەهێنرێن پێش چوونە بەهەشتەوە، پاشان تۆڵەی هەر زوڵمێک لەیەکیان کردبێت لێیان ئەسەندرێتەوە، پاشان پێیان ئەوترێت : ﴿ طِبۡتُمۡ فَٱدۡخُلُوهَا خَٰلِدِينَ ﴾ (الزُّمَر : ٧٣) .

٧٦ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت :

(سوێند بەوەی کە نەفسی منی بەدەستە، لە ڕۆژی قیامەتدا خێر و چاکەی بەندە وا بەرز ئەکرێتەوە کە هیواداره الله بەهۆیەوە لێی خۆش ببێت، پاشان کەسێک دێت ئەڵێت : ئەی پەروەردگار ئەم بەندەیەت زوڵمی لێ کردم .

جا الله لە چاکەکانی ئەبات و ئەیخاتە سەر چاکەکانی زوڵملێکراوەکە .

پاشان کەسێکی تریش ئەڵێت : ئەی پەروەردگارم، بە هەمان شێوە .

جا بەردەوام بەو شێوەیە ئەبێت هەتا وای لێدێت هیچ چاکەیەکی نامێنێت تا بەهۆیەوە پاداشتی بدرێتەوە) .

٧٧ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت :

(مافەکان ئەگەڕێنرێنەوە بۆ خاوەنەکانیان، تەنانەت تۆڵە لە بزنی قۆچدار ئەسەنرێتەوە بۆ بزنی بێ قۆچ) .

٧٨ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت :

(هەر کەسێک بە ناحەق چۆلەکەیەک بکوژێت، لە ڕۆژی قیامەتدا الله دەربارەی لێی ئەپرسێتەوە) .

والحمدلله رب العالمين

https://t.me/Hamam_alathari